بۆ پۆلی پێنجەم و شەشەمی سەرەتایی

# با بیروبڕوای ڕەوشتمان

راست بکەینەوە



عمر عبدالعزيز



چاپی چوارەم

١٤١٨ك - ١٩٩٧ز

# مامۆستای بەڕێز !

ئەمە پانزە وانەیە لە وانەکانی ئیسلام ناسی، بۆ قوتابیانی پۆلی سێیەمی قۆناغی یەکەمی قوتابخانەی مزگەوت.
هەروەک دیارە کردوومانە بە دووبەشەوە:
لەبەشی یەکەمدا (پێنج) وانەی گرنگمان جێکردوەتەوە، بۆ چەسپاندن و بەهێزکردنی بیروبڕوای قوتابیان، لەبەشی دووەمیشدا (دە) وانەی گرنگی ڕەوشتمان دیاری کردووە، کە گونجاوبن لەگەڵ ئاستی خوێندن و تەمەنیاندا.
لەبەشی بڕوادا بەئەنقەست ئەو پێنج وانەیەمان داناو درێژمان نەکردنەوە، چونکە زهنی قوتابی ئەو قۆناغە -لەو بابەتەدا- لەوە زیاتر هەڵناگرێ.
جا مامۆستای بەڕێز ! جەنابت دەتوانی هەر بابەتێک بکەیتە وانەیەک و بە زمانی منداڵەکان شی بکەیتەوە .
ئەوەش ئاشکرایە کە هۆی کاریگەری سەرەکی تێگەیاندنی قوتابیاندا شێوازی جوان و شایستەی مامۆستایە.
ئیتر سەرکەوتوبیت و خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەکمان بێت.





# بەشی یەکەم

## بڕوا بە خوای گەورە

١) بڕوامان وایە کە هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە خوای گەورە، وە پێغەمبەری خۆشەویستمان (محمد) -درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت- نێرراوی ئەوە.
٢) بڕوامان وایە کە خوای گەورە بەدیهێنەری ئێمەو ڕێکخەری ئاسمان و زەوی‌و هەموو دنیایە.
٣) بڕوامان وایە کە خوای گەورە تاک و تەنیایەو لە دروستکردنی دنیادا هیچ هاوەڵ و شەریکێکی نییە، لەبەرئەوە لەپەرستنیشیدا هیچ شەریکێکی بۆ بڕیارنادەین و پەنامان تەنها هەر خۆیەتی‌و جگە لەو پەنای ترمان نییە.
٤) بڕوامان وایە کە خوای گەورە خاوەنی ڕەحمەتی فراوانەو ڕەحمیش دەکات بە بەندەکانی، وە سزای تاوانبارانیش دەدات.
٥) بڕوامان بە (قەزاو قەدەر) هەیەو دەزانین کە هەرچی لەم دنیایەدا ڕوودەدات و بەسەر ئێمەشدا دێت بە ئاگاداری خوای گەورەیەو ئەو لەسەری ڕازییە، وە هەرچی ئەویش بیکات پێمان خۆشەو تەسلیمی فەرمانی دەبین.

## بڕوا بە فریشتەکان

١) بڕوامان وایە کە خوای گەورە فریشتە (ملائکة)ی زۆری دروست کردووەو کاروباری زۆری پێسپاردوون.
٢) بڕوامان وایە کە ئەو مەلائیکەتانە بەندەی خوای گەورەن و گوێڕایەڵی دەکەن و لە فەرمانی دەرناچن .

٣) بڕوامان وایە کەهەندیکیان وەحی بۆ پێغەمبەران دەهێنن (سەلامی خوایان لەسەربێت) وە هەندیکیان ئەو وەحیە دەپارێزن، سەرکردەو گەورەی ئەوانەش (جبریل)ە، -سەلامی خوای لەسەر بێت- .
٤) هەندیکی تر لەو فریشتانە وان لەگەڵ ئێمەداو ئەمانپارێزن و هەموو کردارو گوفتارەکانمان دە نووسن و داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆمان لای خوایگەورە و میهرەبان .
٥) زۆرێکیتریش هەن کە کاری تریان پێ سپێراوە، وەکو: رۆزی دابەش کردن بەسەر خەڵکی جیهانداو دوعاکردن بۆ موسڵمانان و یارمەتیدانیان و شەفاعەت بۆکردنیان و گیان دەرکیشانی خەڵکی لەکاتی مەرگ داو سزادانی بێبڕوایان لەقەبرداو لەدۆزخەخدا و لێدانی شەیپوور (نەفخی سوور)و ..هتد.

## بڕوا بە کتێبە ئاسمانیەکان

١) بڕوامان وایە کە خوایگەورە چەندین پێغەمبەری بۆ چەندین نەتەوەی سەرزەوی ناردووەو، کتێبی بەواندا بۆ رەوانەکردوون، کە هەموویان وەحی خوان و ئیمانمان پێیان هەیە.
٢) گرنگترینی ئەو کتێبانە ئەمانەن: **صحوف** بۆ **ئیبراهیم**، **زەبور** بۆ **داود**، **تەورات** بۆ **مووسا**، **ئینجیل** بۆ **عیسا**، **قورئان** بۆ **محمد** . -سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێت-.
٣) بڕوامان وایە کە ئەو کتێبانە لە ئەسڵ دا هەموویان یاساو شەریعەتی جوانیان تیابووەو رێنموییی خوابوون بۆ ئوممەتەکان.

٤) بڕوامـان وایـه کـه کتێبـەکانی غـەیری قورئـان هـەرکام بـۆ ماوەیـەکی کـەم و ئومـمـەتێکی دیـاریکراو هـاتوون ، وە لـە دواییدا هەندێ لەخوانەترس دەستیان تێخستن و لێیان گۆڕیون.
٥) بڕوامان وایه کە دواهـەمینی ئـەو کتێبانـەو گـەورەترینیان قورئانی پیرۆزە، وە هەرگیز یەک وشەی لێ زیادو کەم نەکراوەو ناش کرێـت، چونکه بەرنامەی خوایه بۆ جیهـان و بـۆ هەمیشـە لەبەرئەوە خوای‌گەورە بڕیاری پاراستنی داوە.

# بڕوا بە پێغەمبەران

١) بڕوامـان وایـه کـه خوای‌گـەورە بـه هـەزاران پێغەمبـەری رەوانەکردووە، بۆ چەندەها نەتەوەی سەرزەوی .
٢) هەموو ئەو پێغەمبەرانەمان خۆش دەوێن و سـڵاوی خوایـان بۆ دەنێرین و جیاوازی ناکـەین لـە نێوانیـاندا، چونکـه هـەموو برای یەکترن و نێرراوی خوای‌گەورەن.
٣) بڕوامان وایــه کـه هـەرکام لـەو پێغەمبەرانـه بـۆ رێنموییـی نەتەوەیەک نێرراون، وە هـەرکام بـه زمـانی نەتەوەکـەی خۆیـان خەڵکەکەیان بۆ رێی خوا بانگ کردووە.
٤) گـەورەی ئــەو پێغەمبەرانــەو دواهــەمینیان ســەروەرمان (محمد) -سـەلامی خـوای لەسـەر ئەوو هــەموو براکـانی - لەپێغەمبەران بێت- .
٥) بڕوامان وایه که ئەو پێغەمبەرانە مرۆڤــن و بـەندەی خـوای گــەورەن، بــەڵام لەهــەموو لایەنێکــەوە نموونــەن، وە دوورن لەهەموو تاوان و گوناهێ.

## بڕوا بە پاشەڕۆژ

١) بڕوامان وایە کە ڕۆژی ڕەستاخێز (قیامە) هەموو مان زیندوودەکرێینەوە.
٢) لەو ڕۆژەدا هەموومان حەشر دەکرێین و لەبەردەم بارەگای خوادا کۆمان دەکەنەوەو لێمان دەپرسنەوەو موحاسەبەمان دەکەن، لەوێدا هەموور ئەندامەکانی لەشمان دێنەدەنگ و لەسەر کارەکانی دنیامان شایەتی دەدەن.
٣) لەو ڕۆژەدا نامەی کردەوەکانی دنیامان پیشان دەدەن، جا ئەگەر ئەهلی بەهەشت بین بەڕێزەوە ئەیدەن بەدەستی ڕاستمانەوە، ئەگەر -پەنا بەخوا- دۆزەخیش بین ئەوا لەپشتەوە یان لای چەپەوە دەیدەن بەدەستمانەوە.
٤) لەو ڕۆژەدا خوای گەورە بەهەشت دەڕازێنێتەوە بۆ موسڵمانان و فریشتەکان مژدەیان پێدەدەن و بەشکۆو ڕێزێکی زۆرەوە دەیانبەن بۆ ناو بەهەشت کە پڕیەتی لەهەرچی نازو نیعمەتی خواییە.
٥) هەروەها لەو ڕۆژەدا دۆزەخ (جەهەننەم) دەرگای دەکرێتەوە بۆ تاوانباران و گوناهکاران و مەلائیکەکان بە توورەییو ڕقەوە فڕێیان دەدەنە ناوی، کە هەموو جۆرە سزاو ئەشکەنجەو ناڕەحەتییەکی تێدایە.

## لەگەڵ خوای گەورەماندا

١) فەرمانەکانی بەجێ دەهێنن و ڕەجای بەهەشت و پاداشتی لێدەکەین.

٢) دووردەکەوینەوە لەو شتانەی لێی قەدەغە کردووین و ترسمان لە دۆزەخ و سزای هەیە.
٣) بە گوێرەی توانامان یادی دەکەین و بیر لە گەورەییو دەسەڵاتی دەکەینەوە.
٤) هەرکارێکی چاک بکەین لەبەرئەوە دەیکەین و بەدڵسۆزییەوە دەیکەین.
٥) هەمیشە داوای لێخۆشبوونی لێدەکەین.
٦) هەموو کارێک بەناوو یادی ئەو دەست پێدەکەین.
٧) لەهەموو کاروبارێکماندا تەنها پشت بەو دەبەستین و داوای یارمەتی هەر لەو دەکەین.
٨) هەر هەڵەو گوناهێکمان کرد یەکسەر پەشیمان دەبینەوەو تەوبەدەکەین و کارێکی چاکە بەدوایدا دەکەین.
٩) وا هەست دەکەین کە هەمیشە چاومان لێیەتی خۆ ئەگەر ئێمە نایبینین ئەو هەمیشە ئێمە دەبینێت و ئاگای لە ورتەی دڵ و هەموو کارو گوفتارێکمانە.
١٠) بۆ هەموو نازو نیعمەتێکی سوپاسی زۆری دەکەین و لەکاتی ناڕەحەتیو (مصیبەت)یشدا خۆڕادەگرین و صەبر دەکەین و دڵنیاین هەموو کارێکی بەحیکمەتە.

## لەگەڵ باوک و دایکماندا

١) بەیانیان کەهەڵدەستین یا هەرکات دەچینەماڵەوە سەلامیان لێدەکەین.
٢) هەمیشە ڕێزیان لێدەگرین و کاتێ کە لە شوێنێک هاتنەوە لەبەریان هەڵدەستین.

٣) لە ئیش و کاری ماڵەوەدا یارمەتیان دەدەین و زەحمەتیان بۆ دروست ناکەین.
٤) ئەگەر ئامۆژگاریان کردین بە گوێیان دەکەین و فەرمانەکانیان بەجێدێنین و بەبێ ئیجازەی ئەوان ناچینە دەرەوە.
٥) کاتێ ویستمان بچینە ژووری نووستنیان تەقە لە دەرگا دەدەین و بەبێ ئیزن ناچینە ژوورەوە.
٦) لەکاتی ئیسراحەت و خەوتنیاندا ناچینە ژوورەکەیان و دەنگەدەنگیش ناکەین.
٧) ڕێزو ئیحترامی ڕەفیقانی باوک و دایکمان دەگرین و هەرکات پێیان گەیشتین سەلامیان لێدەکەین.
٨) لەکاتی نان و چایی و خۆراک و میوە خواردندا پێش ئەوان دەست پێناکەین.
٩) لەکاتی دانیشتندا لە سەروویانەوە دانانیشین.
١٠) داوای شتی زۆریان لێناکەین و بەهانە ناگرین و هەرچیەکیان پێداین و هەر ئەندازە پارەیەکیان داینێ پێی ڕازی دەبین و سوپاسیان دەکەین.

## لەگەڵ دراوسێکانماندا

١)هەرکات پێیان گەیشتین سڵاویان لێدەکەین و ڕێزیان لێدەگرین.
٢) ناچینە سەربانی ماڵیان و بەردو شت ناخەینە حەوشەو بانیان و سەیری ناو حەوشەوماڵیان ناکەین.
٣) ئەگەر ئیشو کارێکیان هەبوو بە گوێرەی توانا یارمەتیان دەدەین.

٤) ئەگەر منالی هاوتەمەنی خۆمانیان هەبوو دەیکەینە هاوڕێی خۆمان و بانگی دەکەین بۆ مزگەوت.
٥) ئەگەر نەخۆشیان هەبوو دەچینە عیادەتیان و دوعای شیفاو چاکبوونەوەیان بۆ دەکەین.
٦) لەکاتی موسیبەت و نارەحەتیدا سەرەخۆشیان لێ دەکەین.
٧) لەکاتی خۆشیو شادەمانییاندا پیرۆزبایییان لێ دەکەین.
٨) خۆڵ و شەخەڵ و شتی تر نارژێنینە بەردەرگایان .
٩) هەرکات ویستمان بچینەماڵیان تەقە لە دەرگا دەدەین و ئیجازەی چوونە ماڵیان لێ دەخوازین و لەکاتی ئیسراحەتیاندا ناچین.
١٠) ئەگەر چووینە لای رەفیقانمان و ماڵە دراوسێکان عاقڵانە دادەنیشین و دەست لە شتومەکیان نادەین و عەزیەتیان ناکەین و زۆر دانانیشین .

## لەگەڵ هاوڕێکانماندا

١) ئەگەر چاومان پێیان کەوت بەڕووی خۆشەوە سڵاویان لێ دەکەین و ڕێزیان لێدەگرین.
٢) بەهەر ناوێک پێیان خۆشە ناویان دەبەین و بانگیان دەکەین.
٣) وەکو برای خۆمان خۆشمان دەوێن و عەیب و ناتەواوییەکانیان دەپۆشین و باسی ناکەین.
٤) هەرچیمان نەزانی لێیان دەپرسین و هەرچیان نەزانی و ئێمە زانیمان پێیان دەڵێین.
٥) لەکاتی دەرسی مامۆستادا قسەیان لەگەڵ ناکەین و سەریان لێتێک نادەین.

٦) هەرکامیان نەخۆش کەوت ئەچینەلایو دوعای شیفای بۆ دەکەین.
٧) ڕێز لە باوک و دایکیان دەگرین و لەهەر شوێنێک دیمانن سلاویان لێدەکەین.
٨) لە پاشملە هەرگیز بەخراپە ناویان نابەین و غەیبەتیان ناکەین.
٩) زۆر ناچینە ماڵیان و ئیزعاجیان ناکەین.
١٠) لەکاتی نارەحەتیدا سەرخۆشییان لێدەکەین و لەکاتی خۆشیو شادییاندا پیرۆزباییان لێدەکەین.

# لەگەڵ مامۆستاماندا

١) هەرکات مامۆستامان دی سلاوی لێدەکەین.
٢) لەبەردەمیازۆر قسەناکەین و دەنگ بەرزناکەینەوەو سوعبەت و یاری لەلایان ناکەین.
٣) کاتێ هاتە ژوورەوە لەبەری هەڵدەستین و ڕێزی لێدەگرین.
٤) کاتێ قسەو باسیکرد گوێی لێدەگرین و قسەی پێنابڕین.
٥) کاتێ دەرسی پێ وتین یا نەسیحەتی کردین بەچاکی گوێی بۆ دەگرین و بەڵێی بۆ دەکەین.
٦) لەکاتی دەرسا بەبێ ئیزن وەرگرتن لەو هەڵناسین و ناچینە دەرەوە.
٧) هەرچی وت پێمان بەگوێی دەکەین و، ئەگەر ئەرکی نوسین و خوێندنەوەی دا بەسەرماندا جێبەجێی دەکەین .
٨) ئەگەر کارو فەرمانێکیدا بەسەرماندا ئەنجامی دەدەین .
٩) پرسیاری زۆری لێناکەین و کاتی بەبێ هوودە ناگرین و، بەلام ئەگەر لە شتێ تێنەگەیشتین پرسیاری لێدەکەین.

١٠) لەکاتی دوعاکردنماندا دوعای خێری بۆ دەکەین، ئەوەی کەدەرسی پێووتین و ڕێنموونی کردوین داوائەکەین خوا لێی خۆش بێت.

# کە چووینە مزگەوت

١) پێش ئەوەی بچینە ناو مزگەوت دەست نوێژ دەگرین و قوروپیسی پۆشاکەکانمان لادەبەین.
٢) کاتێ چووینمە ژوورەوە سلاو لە حازریان دەکەین.
٣) ئەگەر فرسەتمان هەبوو دوو رکات نوێژی سەوقاتی مزگەوت (تحیه المسجد) دەکەین .
٣) لەکەنارێکەوە دادەنیشین و چاوەڕێی نوێژ یا دەرس دەکەین و، ئەگەر بانگیان دا بێدەنگ دەبین و لەبەر خۆمانەوە دووبارەی دەکەینەوە.
٤) دەنگە دەنگ ناکەین و سەر لە نوێژگەران و قورئان خوێنانْ تێک نادەین.
٦) لەکاتی نوێژدا لەگەڵ هاوڕێکانماندا ریز دەبەستین و ناچینە ریزەکانی پێشەوە.
٧) لەسەر خۆ نوێژدەکەین و پەلەناکەین و دەنگمان بەرزناکەینەوە.
٨) کە مامۆستا سەلامی دایەوە گەڕەلاوژێ ناکەین و بێدەنگ دادەنیشین تا پیاوەکان هەستن.
٩) هەرگیز لەمزگەوتا شت ناخۆین و یاری ناکەین و قسەی بێسوود ناکەین، چونکە مزگەوت ماڵی خوایەو دەبێ ڕێزی بگرین.

١٠) ئەگەر شوێنێکی مزگەوت پێویستی بە پاک کردنەوە هەبوو، پاکی دەکەینەوە، خۆیشمان هەرگیز پیس و پۆخڵی ناکەین.

## لە قوتابخانەدا

١) لەکاتی دیارکراودا دەچین بۆ مەکتەب و خۆمان دواناخەین.
٢) ئەگەر گەیشتین بە مامۆستاکانمان سڵاویان لێ دەکەین و ڕێزیان لێ دەگرین.
٣) کە زەنگی چوونەژوورەوەیان لێدا دەچینە ناو پۆل و خۆمان دواناخەین.
٤) کە مامۆستا دەرسی وتەوە بەچاکی گوێی بۆ دەگرین و ئەگەر شتی بۆ نووسین تەماشای دەستی دەکەین.
٥) لەسەر پۆل لەگەڵ هاوڕێکانماندا یاری ناکەین و خەریکی گوێگرتن و نووسینەوەو خوێندنەوە دەبین .
٦) کە زەنگی پشووی دا لەسەرخۆ دەچینە دەرەوەو گەرەلاوژێ ناکەین و یاری عاقڵانە دەکەین و قسەی ناشیرین بە هاوڕێکانمان ناڵێین.
٧) پارمەتی خاوێن کەرەوەی پۆل و قوتابخانە دەدەین و کاغەزو شت فڕێنادەینە ناو پۆل و هۆڵ و حەوشەی قوتابخانە.
٨) دەس لە شتومەکی هاوڕێکانمان نادەین و ئەگەر شتێکمان ویست ئیزنیان لێوەردەگرین.
٩) کتێب و دەفتەرو جانتامان بە پاک و خاوێنی ڕادەگرین و شتی زیادە لە کتێب و دەفتەر و رحلە نانووسین.

١٠) ستومەكی قوتابخانە -وەك دەرگاو پەنجەرەو تەختەو بەلوعەو رحلە- دەپاریزین و نایشكینین، چونكە هی هەموومانە.

## لەكاتی نان خواردن دا

١) پیش نان خواردن دەست و پی‌مان دەشۆین .
٢) چاوەروان دەكەین تا لە خۆمان گەورەتر دەست پی‌دەكات.
٣) پیش دەست كردن بە خواردن بسم اللە الرحمن الرحیم دەكەین و بەدەستی راستمان دەخۆین و لەبەردەمی خۆمانەوە.
٤) هەرچی لەسەر سفرە دانرا و پیمان باشەو زەمی هیچ خۆراكیك ناكەین، چونكە نیعمەتی خوایەو پی‌ی ناخۆشە.
٥) تیكەی بچووك دەگرین و بەچاكی خۆراك دەجوین، ئینجا قوتی دەدەین و پەلە ناكەین و لەسەرخۆ دەیخۆین.
٦) بەدانیشتنەوە شت دەخۆین و بەپیوە یا لەراكشاندا شت خواردن لامان باش نی‌یە.
٧) كە تیریش بووین سوپاسی خوا دەكەین و دەچینە دواوەو زیاد لەحەد ناخۆین، چونكە نەخۆش دەكەوین.
٨) ئەگەر رەفیق یا میوانمان لەگەل بوو هەلناسین تا ئەوان لی‌ببنەوەو بۆ ئەوەی شەرم نەكەن و تیربخۆن.
٩) ئەوەندەی پیمان بخوریت چیشت رادەكیشین و خۆراك خەسار ناكەین و قاپی خۆمان -ئەگەر پیمان خورا- سوننەتی دەكەین و تەواوی دەكەین.
١٠) پاش هەستان لەسەر سفرە یارمەتی دایك وخوشكمان دەدەین و سفرەیان لەگەل كۆدەكەینەوە پاشان دەستو دەممان دەشۆین .

# پاک و خاوێنی

١) هەموو بەیانی‌یەک پێش نـان وچـای خـواردن دەسـت و دەم چاومان دەشۆین.
٢) هەروەها پێش هـەموو نـان خواردنێـک دەستمان بـەچاکی دەشۆین، چونکە بەدەستی پیسەوە نابێت نان بخۆین.
٤) پاش نان خوردنیش دەست و دەممان دەشۆین.
(٥) ماڵەوە پیس ناکەین و کاغەزو شتی‌تر بڵاوناکەینەوە.
٦) پۆشـاک و پێـڵاوو شـت و مـەکـەکانمان خـاوێن رادەگریـن و پیسیان ناکەین، چونکـە دایکمـان بەشـتنیان ئەزیـەتی دەبێـت، دایکیش گوناهە.
٧) کـە چووینـە ئاودەسـتخانە نایـەڵین قـاچ و قـول و پۆشاکەکانمان پیس بـن، لـەنوێژچین، ئاودەستخانەیش پیـس ناکەین و بەدەستی چەپ تارەت دەگرین و دوای ئاودەکـەین بـە ئاودەستەکەدا.
٨) کە لە ئاودەستخانە هاتینە دەرەوە دەست و پێمان دەشۆین و، ئەگەر وا نەکەین لەوانەیە نەخۆش بکەوین.
٩) هیـچ شـتێک فڕێنادەینـە شـەقام و نـاو باخچـەو کـۆلان و قوتابخانەو نەخۆشخانەو شوێنە گشتی‌یەکان وە ئەگەر ویستمان شتێک فڕێبدەین، دەیخەینە زبڵدان و سـەبەتەی پاشماوەوە.
١٠) تا بۆمان بکرێت شتی پیسی سـەرجادە نـاخۆین چونکـە ئەپوتۆزو میکرۆبی پێوەیە لەوانەیە نـەخۆشمان بخـات، ئەگـەر شتێکیش بخۆین ئەبێ سەرگیراوو پاک و خاوێن بێت.

# لە کۆڵان و شەقام و بازاڕدا

١) بەبێ ئیشی پێویست لەماڵ ناچینە دەرەوەو کاتمان بـەفیڕۆ نادەین.

٢) ئەگەر دوای دەرس خوێندن و وەزیفە نووسینەوە زۆر بێتاقەت بووین ئیزن لە باوک و دایکمان وەردەگرین و دەچینەلای ڕەفیقە چاکەکانی خۆمان و هاوڕێیی منالی چەقاوەسوو خراپ ناکەین.
٣) لەبەردەرگای مالاندا ناوەستین و ئەگەر لەگەڵ ڕەفیقێکیشماندا ڕاوەستاین لە کەنارەوە دەبین.
٤) ئەگەر دەرگای مالێک کرابووەوە سەیری ناو مالەکە ناکەین.
٥) بەسەر شۆستەکاندا دەڕۆین و ناچینە سەر شەقامەکان، چونکە شەقام هی ئۆتۆمبیلەو لێمان دەدات.
٦) لەبازاڕدا دەست لە شت و مەکی دوکاندارەکان نادەین و لەبەر دوکانەکانیاندا بێئیش ڕاناوەستین.
٧) لەسەر شەقامەکان ئاگامان لە خۆمانەو سەیری ئەملاوئەولای خۆمان دەکەین، ئەگەر سەیارەمان دی ناپەڕینەوە تا تێپەڕ نەبێت.
٨) ئەگەر گلۆپی سووری هاتوچۆ داگیرسابوو ناپەڕینەوە تا گلۆپە سەوزەکە هەڵ دەبێت.
٩) تا بۆمان بکرێت بەسەر خەتی تایبەتی پەڕینەوەدا دەڕۆین و گوێ بۆ ڕێنومایییەکانی پۆلیسی (مرور) دەگرین.
١٠) ئەگەر کوێرێک یا پیرێک یا نەخۆشێک پێویستی بە یارمەتیو دەست گرتن و ڕێنومایی هەبوو، یارمەتی دەدەین و دەیپەڕێنینەوە.



